حکومەتی هەرێمی کوردستان ـ عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# خوێندنەوەی کوردی

# بـــۆ

# پۆلی چوارەمی بنەڕەتی

دانانی
لیژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە

بژارکردنی
سادق ئەحمەد عوسمان ڕوستایی
خەسرو عەلی حەسەن
ئیسماعیل محەمەد عەبدوڵڵا
نەمام جەلال ڕشید

چاپی نۆیەم ٢٠١٦ زاینی ٢٧١٦ کوردی




سەرپەرشتی زانستی چاپ:
نەمام جەلال ڕشید
سەرپەرشتی هونەری چاپ:
عوسمان پیرداود کواز
خالد سلیم محمود
دیزاین و ئامادەکردنی نیگارەکان:
عادل زرار
جێبەجێکردنی بژاری هونەری:
نێرگز نورالدین کاکە مصطفی

# پێشەکی

مامۆستای بەڕێز ئەم پەرتووکەی کە لەبەر دەستتدایە لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششێکی زۆر بەم شێوەیە دانراوە و ڕێکخراوە و خراوەتە بەر دەستتان.

ئەم پەرتوکە جیاوازە لە پەرتوکە کوردییەکانی پێشتر لەم پەرتوکە بابەتی ڕێزمانی بە شێوازێکی ئاسان خراوەتە ناو پەرتوکی خوێندنەوە، جا بۆ بەشە وانەکانی زمانی کوردی لە خوێندنەوە و دارشتن وهۆنراوە لەبەرکردن و ڕێنووس و خۆشنووسیدا، هەر بەشەیان لە خزمەت بەشەکانی دیکە دایە و بەهەموویان زمانە شیرینەکەمان پێک دێنن. بۆیە پێویستە لە دابەشکردنی بەشە وانەکانی زمانی کوردی بەسەر ڕۆژەکانی هەفتەدا هەر لەسەرەتای ساڵەوە گرنگی پێبدرێت و قوتابییان و خوێندکارانی لێ ئاگادار بکرێتەوە.. هیچ بەشێکیان نەکرێتە قوربانی بەشەکەی دی.

ئامانج لەم پەرتوکە ئەوەیە کە خوێندکاران بتوانن بە زمانێکی کوردی ڕەوان بدوێن و بنووسن و بخوێننەوە و گەشەی پێبدەن، ئەم ئامانجانە بە هاوکاری هەموو لایەکمان بێتە دی، ئەم پەرتوکە پێویستیەکی زۆری بە تێبینی و بۆچوون و باری سەرنجی ئێوەی بەڕێزە، بۆیە داواکارین دڵسۆزانە هەڵی سەنگێنن و ڕای خۆتانی لەسەر دەربڕن. ئەگەر هەر تێبینی و کەم و کوڕییەک یان هەر شتێکی لەم بارەوە هەبوو بە ڕێگای پەروەردەکان ئاگادارمان بکەنەوە. بۆ ئەوەی گوڵزاری پەرتوکەکە لە چاپەکانی داهاتوو پوختەتر و گەشاوەتر بێت. هەر سەرکەوتوو بن..

لیژنەی دانانی پەرتوک

# ساڵی نوێی خوێندن

لەم ڕۆژانە دلێر دڵی بەوە خۆشە، کە پشووی هاوین بەسەر دەچێت و ئەمیش بە دیداری قوتابخانە و قوتابییان و مامۆستاکانی شاد دەبێتەوە.

دلێر بەڵێنی داوە هەر لەسەرەتای کردنەوەی قوتابخانەوە، زۆر بەڕێکوپێکی دەست بکات بەخوێندن و هەموو ڕۆژێک کۆشش بکات و ئەرکەکانی ئەنجام بدات و ئیشی ئەمڕۆ نەخاتە سبەینێ، چونکە دەزانێت، هەر بەهۆی خوێندنەوە دەتوانێت دەست لە ملی هیوا و ئاواتەکانی بکات.

دلێر پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێ و مامۆستاکانی زۆرباشە و هەموویانی خۆشدەوێت و ڕێزیان لێدەگرێت.



ئاواتی دلێر ئەوەیە، کەهەموو قوتابییان کەلوپەلی قوتابخانەکەیان وەک کەلوپەلی خۆیان بپارێزن و بە تەنگیانەوە بێن، پارێزگاری لە پاکژی قوتابخانە و باغچەکەیان بکەن و لە لیژنەی پاکژی قوتابخانە بەشداری بکەن. گوێڕایەڵی ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی مامۆستا دڵسۆزەکانیان بن، چونکە مایەی بەختەوەریانە لە ژیان.

## واتای وشەکان:

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| دیدار | : | چاوپێکەوتن |
| بە تەنگییەوەبین | : | بییان پارێزین، خەمی بخۆین |
| پاکژی | : | پاکوخاوێنی. |

## ڕاهێنان (١)

## وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. کەی پشووی هاوین دەست پێدەکات؟ کەی دوایی دێت؟
٢. لە پشووی هاویندا بەچییەوە خۆت خەریک دەکەیت؟
٣. بۆچی دلێر حەزی دەکرد زوو دەرگای قوتابخانە بکرێتەوە؟
٤. بەرامبەر بەئامۆژگاری و ڕێنمایی مامۆستاکانت، دەبێت چ هەڵوێستێک بنوێنیت؟
٥. چۆن قوتابخانەکەت بە پاکژی ڕادەگریت؟

## ڕاهێنان (٢)

لەم پیتە پەرشانەی خوارەوە وشە دروست بکە:

١. ک، س، ر، و، ت، ا، د، ن.

٢. پ ، ش ، ە ، گ ، م ، ێ ، ر.ە.

٣. س، ب ، ە ، خ ، ۆ ، ی ، ر ، ە، یـ.

٤. ئـ، ی ، د ، ا ، ز.ا .

## چالاكی

مامۆستا: خوێندکارانی پۆلەکە بکات بەچەند دەستەیەک بۆ ئەوەی لەسەر چۆنیەتی بەسەربردنی پشووی هاوین گفتوگۆ بکەن. پاشان خوێندکارێک لەهەر دەستەیەک لەبەردەم خوێندکاران ئەنجامی گفتوگۆکە بگێڕێتەوە.

# قوتابی ژیر



ئێمە قوتـابی ژیـــــرین
خاوەنی هۆش و بیریــــن

شاگردی ڕێی ڕوناکیـــن
وێنەی بەرزی و دڵپاکیـــن
خامە و کتێب و دەفتـــەر
هەرسێی دەخەینە سەرسەر
پێی فێردەبین زانستــــی
ڕەوشت جوانی و ڕاستـــی
مامۆسـتایە ڕابەرمــــان
فەرمانی لەسەر سەرمـــان
ئیتر دەبێ بخوێنیـــــن
نـەزانین لەبن بێنیــــن

«مـحەمەد دارياس»

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| ژیر | ئاقڵ |
| خامە | پێنووس |
| ڕابەر | پێشەنگ |

# ئـــــــــارام



ئارام نەمامێکی ناشت، نەمامەکە گەڵای کرد، گەورە بوو، بوو بە درەخت، باڵندەکان بەسەر لق و پەلەکانیەوە دەنیشتنەوە، هێلانەیان لەسەر دەکرد، لەبەری دارەکەیان دەخوارد، گیانیان دەحەسایەوە و ماندوویەتیان دەردەچوو دەزانیت چیان دەگوت؟

دەیانگوت: تەمەن درێژبێت ئەو کەسەی ئەم درەختەی لێرە ناشت.

شوانێک لە ڕۆژێکی گەرمی هاوین ڕانەمەڕەکەی بەرەو لای ئەو درەختە برد، لەوێ مۆڵیدان.

مەڕەکانی لە گەڵای وەریوی ئەو درەختە تێربوون و کەوتنە کاوێژکردن شوانە لە لایانەوە لەژێر سێبەری ئەو درەختە لێی ڕاکشا، دەزانیت شوانەکە چی گوت؟

گوتی: هەزار ئافەرین لەو کەسەی ئەم درەختەی لێرە ناشت و بەختەوەر بێت لە ژیان.

ڕێبوارێکی ماندوو، کە لەدوورەوە هاتبوو، لای دایە ژێر درەختەکە و دانیشت، کۆڵە پشتەکەی کردەوە، نانی خۆی خوارد و پاشان سەری هەڵبڕی و لە گەڵاو لق و پۆپی درەختەکەی ڕوانی.

دەزانن ڕێبوارەکە چی گوت؟

ڕێبوارەکە گوتی: هەزار هەزار سوپاس بۆ ئەو کەسەی کە ئەم درەختەی لێرەدا ناشت و خودا لە دایک و باوکی خۆشبێت.

هاوڕێیانی خۆشەویست، باڵندە، ئاژەڵ، مرۆڤ، هەریەکەیان سوپاسی خۆیان بۆ ئەو کەسە نارد، کە درەختەکەی ناشت، بە ناشتنی درەختەکە خزمەتێکی گەورەی بە هەموویان گەیاند.

پێشینان ڕاستیان گوتووە: (چاندیان خواردمان، دەیچێنین دەیخۆن)

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| ماندوو | : شەکەت |
| حەسانەوە | : پشوودان |
| ڕان | : مێگەل |
| کاوێژکردن | : جوینەوەی خۆراک لەلایەن مەڕو ماڵاتەوە. |
| کۆڵە پشت | : ئەو کۆڵەیە، لە پشت دەبەسترێت |
| هەڵیڕوانی | : سەیری کرد، تەماشاکرد |
| ناشت | : چاند |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. منداڵەکە چی ڕواند؟

٢. بۆچی ئێمە دەبێت، دار و درەخت بپارێزین؟

٣. منداڵەکە بە ناشتنی نەمامەکە، خزمەتی بە کێ گەیاند؟

٤. ئەوانەی لەژێر درەختەکەدا حەوانەوە، چییان دەگوت؟

## ڕاهێنان (٢)

هەر یەک لەم وشانەی خوارەوە لە چەند پیت پێکهاتوون:

١. کەرکوک .................

٢. خانەقین .................

٣. مەندەلی .................

٤. شەنگار .................

٥. مەخمور .................

# چالاکی

قوتابی زیرەک:

پەیڤەکانی (مانگ، چێڵ، ئازاد، سێو، پشدەر) هەموویان ناون و هەریەکەیان بۆ ناونانی شتێک یان کەسێک یان ئاژەڵێک بەکاردێن، دەتۆش هەندێ ناو بنووسە کە بۆ ناونانی هەریەکە لەمانەی خوارەوە بەکاردێن:

١. کەس ..................

٢. ئاژەڵ ..................

٣. شت ..................

٤. شوێن ..................

٥. ڕووەک .....................

# دلڤین و ژینــــــــگه



دلڤین خوێندکارێکی زیرەکە لە پۆلی چوارەمی بنەڕەتی دەخوێنێت، رۆژێکیان لەگەڵ دایک و باوکی لەناو باخچە دانیشتبوون گفتوگۆیان دەکرد.

دلڤین بە باوکی گوت: باوکە، ئەمڕۆ مامۆستا پرسیارێکی لە ئێمە کرد گوتی: بۆچی ئاووهەوای گوند لە هی شار خاوێنترە؟ بەڵام کەس لە ئێمە نەیزانی وەڵامی ڕاست بداتەوە، لەبەر ئەوە مامۆستا بە ئێمەی گوت بۆ خۆتان پرسیار بکەن.

باوک : کچەکەم، گوند هەموو دارو درەخت و سەوزاییە، ئەو سەوزایەش گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەمژێت و ئۆکسجینی دەداتەوە و هەوا خاوێن دەکات، بەڵام لە شارەکان دانیشتوان زۆرترن و کارگە و ئۆتۆمبێلی لێ هەیە کە ژینگە پیس دەکەن.

دلڤین: باوکە، چۆن دەتوانین ژینگەی شارەکان پاک ڕابگرین؟

باوک: کچە شیرینەکەم دەبێت کارگەکان ببەینە دەرەوەی شارەکان و لەناو شارەکان باخچە دابنێین و دار و درەختیان لێ بچێنین.

دلڤین: باشە بابە، چ نەخۆشییەک لە هەوای پیس پەیدا دەبێت؟

باوک: کچەکەم، زۆر نەخۆشی لە هەوای پیس پەیدا دەبن، وەک تەنگە نەفەسی کە سینگی مرۆڤ زامدار دەکات.

دلڤین: سوپاس بابە بۆ ئەو زانیارییانە، بەیانی وەڵامی مامۆستا دەدەمەوە.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| ژینگە | : دەوروبەر |
| سەوز | : کەسک |
| کارگە | : کارخانە |
| تەنگە نەفەس | : بەرەنگ |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. مامۆستا چ پرسیارێکی لە قوتابییان کرد؟

٢. جیاوازی نێوان شاروگوند چییە؟

٣. سەوزایی داروردەخت چ سوودی بۆ ژینگە هەیە؟

٤. چۆن دەتوانین ژینگەی شارەکان خاوێن ڕابگرین؟

## ڕاهێنان (٢)

کچ: کچان

تۆش ئەم ناوانەی خوارەوە وەک سەرەوە لێ بکە:

ژن:

کوڕ:

بەرخ:

گوڵ:

بزن:

## چالاکـــــی

خوێندکاری خۆشەویست:

پاراستنی ژینگەی خوێندنگە دەکەوێتە ئەستۆی تۆ و هاوڕێکانت چۆن دەتوانن ئەم ژینگەیە پاکوخاوێن ڕابگرن؟

# ڕەوشتی ڕێگەوبان



ئارام گوتی: کاتێک گوێم لە ڕادیۆ گرت، سیروان و کارۆخ لە بەرنامەی منداڵاندا وتووێژیان لەگەڵ یەکدی دەکرد، لەسەر ڕەوشتی ڕێگاوبان.

سیروان دەستی بە ئاخافتن کرد و گوتی:

کۆمەڵگە و ڕێگەوبان، خووڕەوشت و یاسای تایبەتی بە خۆی هەیە، ئەگەر جەماوەر پێڕەویان بکات، لە مەترسییەکانی ڕێگەوبان دوور دەکەونەوە و دەحەوێنەوە، بۆیە پێویستە هەموو ئادەمیزادێک یاسا و ڕەوشتەکانی ڕێگەوبان بزانێت و ڕێزیان لێبگرێت و جێبەجێیان بکات.

کارۆخ هەڵیدایێ و گوتی: ئەو خوو ڕەوشت و یاسایانە چین؟

سیروان گوتی: ئەو خووڕەوشت و یاسایانە ئەوەیە کە مرۆڤ لەکاتی ڕۆیشتن، نە پەلە بکات و نە زۆر بەهێواشی بڕوات.

لەسەر شۆستەوە ڕێ بکات و نابێت لەم ڕۆیشتنەی خۆی بە خوێندنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامەوە خەریک بکات، نابێت لە چەقی ڕێگا لەگەڵ هاوڕێکانی ڕابوەستێت و گفتوگۆ بکات و ڕێگە لە هاتووچۆکەران بگرێت.

هەروەها ئەگەر کەسێک ویستی سواری پاس و ئۆتۆمبێل بێت، پێویستە لە پێشدا چاوەڕێی ئەو کەسانە بکات کە دەیانەوێت دابەزن، پاشان کە نۆرەی هات سواری پاسەکە بێت و نۆرە بڕی لەکەس نەکات.
دیسان کارۆخ لە سیروانی پرسی: ئایا خوورەوشتی دیکەی ڕێگەوبان هەیە؟
سیروان وەڵامی دایەوە و گوتی:
بەڵێ گەلێک ڕەوشت و یاسای دیکەی ڕێگەوبان هەن، وا بۆت باس دەکەم، لەوانە ئەگەر کەسێک ویستی جێگەیەکی تایبەتی نیشان بدەیت، پێویستە ڕێزی بگیرێت و زۆر بە ڕوونی و بە چاکی شوێنەکەی بۆ دەستنیشان بکەیت هەروەها لە چوونە ژوورەوەی شوێنە گشتی و جەنجاڵەکان، وا چاکە بچیتە سەرەوە و پەلە ونۆرە بڕی لە کەس نەکەیت، چونکە ئەمە نیشانەی پەروەردەی باش و ڕەوشت بەرزی و خۆشەویستی یاسا دەردەخات.
ئەوەش بزانە، کە پێغەمبەر موحەمەد (د.خ) دەربارەی ڕەوشتی ڕێگەوبان ئامۆژگاریمان دەکات و دەفەرموێت:
(چاولێپۆشین و ئازارنەدان و سڵاوکردن و وەڵامدانەوەی سڵاو، خۆ دوورخستنەوە لە خراپە و نزیک کەوتنەوە لە چاکە ) پێڕەوبکەن.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| شۆستە | : سەکۆی قەراغی شەقامە |
| جەماوەر | : خەڵک |
| پێڕەو | : لەسەر ڕۆیشتن، پەیڕەو |
| وتووێژ | : گفتوگۆ |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. چۆن ڕێنمایی کەسێکی نەشارەزا دەکەیت، کە دەیەوێت سواری پاس بێت؟

٢. لە شەقام چۆن دەپەڕیتەوە؟

## ڕاهێنان (٢)

ڕاست و هەڵەی ئەم ڕستانە دیار بکە:

١. یاریکردن لەسەر چەقی ڕێگا کارێکی دروستە.

٢. خوێندنەوەی گۆڤار و ڕۆژنامە بە دەم ڕێوە بەسوودە.

٣. ڕێگەوبان ڕەوشت و یاسای تایبەتی خۆی هەیە.

٤. لەکاتی پێویستیدا داوای هاریکاری لە پۆلیسی هاتووچۆ دەکەین.

٥. گوێ بەنۆرە نادەین و نۆرە بڕی لە کەسانی دیکە دەکەین لە شوێنە گشتییەکان.

# کوردستان




پیرەمێردێ
چووە قوتابخانەی گوندێ
لە حەوشەکەدا ڕاوەستا
دەورەیان لێدا مامۆستا
ها خاڵەگیان..
چیت گەرەکە ها خاڵەگیان...؟
پیرەمێردی بەستەزمان
کە لاواز بوو بوو وەک گۆچان
وتی: توخوا مامۆستا گیان
فێرم ناکەی چۆن بنووسم کوردستان

(لەتیف هەڵمەت)

لەتیف کوری مەحمود کوری شێخ محەمەدی کەسنەزانیە، لە ساڵی ١٩٤٧ ی زاینی لە شارۆچکەی ( (کفری)) هاتۆتە دونیاوە، زیاتر لە ١٣ بەرهەمی بۆ منداڵان بڵاو کردۆتەوە.

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. ئایا پیرەمێردەکە خوێندەوار بوو؟

٢. کێ بوون ئەوانەی دەوری پیرەمێردەکەیان دابوو؟

٣. پیرەمێردەکە لە قوتابخانەکە داوای چی کرد؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. پیرەمێردێک چووە .................... ی گوندێ.

٢. ها خاڵەگیان .................... .

٣. وەکو گۆچان .................... .

٤. فێرم ناکەیت چۆن .................... کوردستان.

# ناوی هەموومان کوردییە



لە پشووی هاوین کۆمەڵێک کوڕ و کچی زیرەک لە گەڕەکی ئێمە بڕیاریان دا کە پێکەوە بچنە خولی فێربوونی کۆمپیوتەر، یەکەم جار چوونە بنکەی فێرکردن و ناوی خۆیان نووسی.

لە یەکەم ڕۆژی خولەکە مامۆستا کامەران هاتە ژوورەوە بەخێرهاتنێکی گەرمی فێرخوازانی کرد و خۆی پێناساندن، گوتی: ناوی من کامەرانە هیوای کامەرانی و سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.

لە دواییدا داوای لە فێرخوازان کرد کە ئەوانیش خۆیان بناسێنن و ئەگەر بتوانن ناوی خۆیان لە ڕستەیەکدا بەکاربهێنن کە پەیوەندی بە ناوەکانیانەوە هەبێت.

- ناوی من (ئـازاد)ە، باوکی من لە ڕێگای ئـازادی کوردستان شەهیدبوو.
- ناوی من (کوردستان)ە، کوردستان وڵاتی ئێمەیە و وەك بیلبیلەی چاومان دەیپارێزین.
- ناوی من (سەفین)ە، سەفین چیایەکی بڵندە و دەکەوێتە ناوچەی شەقڵاوە لە پارێزگەی هەولێر.

- ناوی من (گەشبین)ە، هەموو کاتێک گەشبینم چونکە کورد دڵسۆزی دۆزی خۆیانن.
- ناوی من (زانا)یە، کورد پێویستی بە مرۆڤی زانا و وشیارە.
- ناوی من (هێڤی)یە، هیوای ئازادبوونی سەرتاسەری کوردستان دەخوازم.
- ناوی من (هەڤاڵ)ە، من هەڤاڵ و دۆستی هەموو گەلانم.
- ناوی من (هەرمان)ە، کورد هەردەمێنێ هەرچەندە دوژمن و نەیاری زۆربن.

مامۆستا کامەران سوپاسیکردن، بۆ ئەوەی کە ناوەکانیان کوردییە. چونکە ناو ناسنامەی نەتەوەیە و شانازی پێوە دەکرێت.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| گەڕەک | : | تاخ، ڕەندەک |
| فێرخواز | : | خوێندکار، قوتابی |
| بیلبیلەی چاو | : | گلێنەی چاو، بیبیک |
| بڵند | : | بەرز |
| گەشبین | : | ڕووناکبین، بەئومێد |
| نەیار | : | ناحەز، دوژمن |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. کوڕو کچانی زیرەکی گەڕەک بڕیاریان دا بچن بۆ کوێ لە هاوین؟

٢. مامۆستا کامەران چۆن خۆی بە فێرخوازان ناساند؟

٣. شەش ناوی کوردی بۆ کوڕان و شەش بۆ کچان بڵێ؟

## ڕاهێنان (٢)

ڕاست و هەڵە لەم ڕستانەدا دەستنیشان بکە:

١. کۆمپیوتەر ئامێرێکی بە سوودە بۆ قوتابییان.

٢. نابێت ئێمە بەشداری لە خولی کۆمپیوتەر بکەین.

٣. ناوی کوردی ناسنامەی نەتەوەیی ئێمەیە.

٤. ناوی بیانی لە ناوی کوردی خۆشترن.

٥. ئەمڕۆ زۆربەی قوتابخانەکانی کوردستان کۆمپیوتەریان هەیە.

## چالاکی

خوێندکاری خۆشەویست:

ئەم ناوانە چ واتایەک دەبەخشن؟

( شێرزاد، ئازاد، ڕێبین، نەورۆز، نازدار، شیرین )

# (پەڵە هەورێک سەربوردەی خۆی دەگێڕێتەوە)



نازەنین لە ڕۆژێکی وەرزی زستان هەورێکی ڕەشی دی، خەڵك بوو بەری ئاسمانی دەگرت. زۆر پەست بوو، ڕووی کردە دایکی و پێی گوت:

من دڵم بەم هەورە خۆش نییە. دایکی زەردەخەنە گرتی و کچەکەی ماچکرد و پێی گوت: بۆچی کچم؟

خەڵك بە هاتنی هەور و باران دڵخۆش دەبن، لەبەر ئەوە پێویستە تۆیش لەو خۆشییە بەشداری بکەیت.

نازەنین گوتی: چۆن خەڵک بە باران دڵخۆش دەبن؟

لە کاتێک باران تەڕیان دەکات ڕێی هاتوچۆ و یارییان لێدەگرێت.

دایکی گوتی کچم ئەگەر تۆ پرسیار لە پەڵە هەورێک بکەیت، تا سەربوردەی خۆیت بۆ بگێڕێتەوە، کە چۆن دەگاتە کوردستانی ئازیزمان و بارانمان بۆ دەبارێنێت، زۆر دڵت پێی خۆشدەبێت.

نازەنین: دایکە زۆر ئارەزوو دەکەم گوێ لە باسی پەڵە هەورێک بگرم.
دایکی گوتی: کەوابوو سەرێک هەڵبڕە وسەیری ئاسمان بکە وبپرسە لە پەڵە هەورێک، با سەربوردەی خۆیت بۆ بگێڕێتەوە.
نازەنین سەری هەڵبڕی و لە پەڵە هەورەکەی پرسی، تۆ چیت و چۆن دروست بوویت؟
لە وەڵامدا پەڵە هەورەکە گوتی: ئەی نازەنین، وەکو دەزانیت ئاوی سەر زەوی هۆی ژینی هەمووانە، بوونی من لە ئاوی زەریا و دەریا و گۆمەکانەوەیە.
کاتێک ڕۆژ هەڵدێت و گەرمایی بەسەر ئاوی دەریاکاندا بڵاودەکاتەوە، لەسەر ڕووی ئەو ئاوانەوە سووک دەبم و دەبم بە هەڵم، وردە وردە بەرز دەبمەوە و پاشان هەوایەکی جوڵاو بەرەو ئاسمان دەمبات، تا لە بەرزایی ئاسماندا تووشی چینە ساردەکانی هەوا دەبم و لەتاو سەرما چڕ دەبمەوە و ڕەنگم سپی دەبێت و دەبم بە هەور.
نازەنین: ئەی چۆن لەو دەریا دوورانەوە گەیشتیتە وڵاتەکەمان؟
هەور: با بە ئارەزووی خۆی بەم لاو بە ئەو لادا دەمگێڕێت، تا دەگەمە لای ئێوە، لێرەش تووشی هەوایەکی ساردتر دەبم و دەگۆڕێم و زیاتر چڕ دەبمەوە و دەبم بە باران و بەشێوەی ئاوێکی سازگار دەبارێم بەسەرتانداو دەگەڕێمەوە سەر زەوی و جۆگە و کێڵگە و دەشت و کێوە تینووەکان تێر ئاودەکەم.
دارودرەخت و گژوگیاتان بۆ ئاودەدەم، تا ئێوەش بەرووبوومەکەی بخۆن، پاوانەکانتان بۆ سەوز دەکەمەوە، تا مەڕو ماڵات و ڕەشە وڵاخەکانتان تێری لێبخۆن، پاشان لە چەم و دۆڵ و شیو و ڕووبارەکاندا کۆ دەبمەوە و ئاوتان بۆ خواردنەوە و جێبەجێکردنی پێداویستییەکانتان پێدەبەخشم.

دووباره له دوایدا دەگەڕێمەوە بۆ دەریا و زەریاکان، بۆ ئەوەی خولی ئاو له سروشتدا نوێ بکەمەوە.

خاتوو نازەنین، ئەمە چیرۆکی ژیانمە، بەهۆی زۆری پیت و فەڕمەوە خەڵکی بەهاتنم دڵخۆش و شادمان دەبن، به دواکەوتنم دڵگیرو دڵتەنگ دەبن، نازەنین له پەستبوونەکەی زۆر پەشیمان بووەوە و بڕیاری دا هەرکە هەورێکی بینی، بەرەو کوردستان دێت، ئەویش لەگەڵ خەڵکی دڵخۆشبێت.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| سەربوردە | : بەسەرهات |
| زەردەخەنە | : خەندە، بزە، پێکەنین |
| ئارەزوو | : حەز، خولیا |
| چڕ | : خەست |
| سازگار | : ڕەوان، خاوێن، خۆش |
| پاوان | : لەوەڕگە |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. بۆچی نازەنین بە بینینی هەور پەست دەبوو؟
٢. هۆی چییە خەڵکی بە باران بارین دڵخۆش دەبن؟
٣. هەور چۆن دروست دەبێت؟
٤. جگە لە باران چی دیکە لە هەور دەبارێت؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم وشانەی خوارەوە بخەرە ڕستەی تەواوەوە:

( لافاو، چلورە، تەرزە، زوقم، بەفر )

# وەرزش



وەرزش گزنگێکی گەشـــــــە
شەنگی دەست و قاچ و لەشە
نەخۆشی و بێ هێزی و سستی
تیپی وەرزش لێی بێ بەشـــە
گەنجان قوتابییانی زرنــــگ
وەرزش وانەیەکە گرنــــگ
بەرگی بێــــــــــزاری دادڕن
هەڵمەت بەرن وەکـــو پڵنگ
یاری و ڕاهێنانی جـــــوان
لەکاتی ئێوارە و بەیــــــان
بیکەن بەخوو تاکو مــــاون
هەل نەدۆڕێنن لە ژیــــان

( مەدحەت بێخەو )

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| گزنگ | : | تیشکی ڕۆژ کە بەیانییان لە شوێنی بەرز دەدات. |
| شەنگ | : | شۆخ، جوان |
| سستی | : | خاو و خلیچکی، خاقی |
| زرنگ | : | زیرەک و وریا |
| هەڵمەت | : | پەلامار، هێرش |

## چالاکی

ئەمانەی خوارەوە فێربە:

| | | |
|---|---|---|
| منیش | : | ئەز ژی |
| تۆش | : | تو ژی |
| ئەویش | : | ئەو ژی |
| ئێمەش | : | ئەم ژی |
| ئێوەش | : | هون ژی |
| ئەوانیش | : | ئەو ژی |

# وردبیـــــن



لە سەرەتای پێشکەوتنی زانستی ژیان ئەو بۆچوونانەی دەربارەی زیندەوەران هەبوو، بۆ چوونێکی سادە و ناتەواو بوو.

چونکە زیندەوەران جاران هەر لەبەرچاو تەماشا دەکران و دەبینران و لێیان دەکۆڵرایەوە.

لە سەدەی یازدە، یەکەم هاوێنە (عدسە)ی گەورەکەر دروستکرا.

لە دوا ساڵەکانی سەدەی سێزدە، لە ئیتاڵیا بۆ یەکەمجار چاویلکەی پزیشکی دروستکرا.

دەڵێن دوو کوڕی پیاوێکی هاوێنە دروستکەر، بە دەم گەمە و یاریکردنەوە بە هاوێنەکانی باوکیان، بە ڕێکەوت دوو هاوێنەیان خستۆتە سەر یەک، کە تەماشایان کرد، شتە وردەکان زۆر گەورە دەبن.

ئەم ڕێکەوتە بوو بە سەرەتایەکی زۆر گرنگ و بە سوود بۆ دروستکردنی یەکەم (وردبین)ی سادە و ساکار، کە دوو هاوێنەیان لەمسەر و ئەوسەری بۆرییەک چەسپدەکرد، بە ئاسانی شتە وردەکانیان بە گەورەیی دەبینی.

پاش ئەم رووداوە (لیڤنهۆک) ی زانای هۆڵەندی توانی بە تاقیکردنەوەکانی خۆی (٢٤٧) جۆرو سیستەمی وردبینی دابهێنێت و خشتەی بۆ دابنێت و نەخشەی بۆ بکێشێت.

ئەو هاوێنە وردبینەی ئەم زانایە دروستیکرد، دەیتوانی هەموو ئەو زیندەوەرە زۆر وردانە لەنێو دڵۆپە ئاوێکی زۆنگاودا دەربخات، کە پێیان دەگوترێت (میکرۆب)، کە هەرگیز بەچاو نەدەبینران، پاشان زانای گەورەی سروشت و لێکۆڵەرەوەی زانستەکانی ژیان (رۆبەرت هۆک) بەهۆی بەکارهێنانی سێ هاوێنە توانی وردبینێکی زۆر باشتر و لەبارتر دروستبکات.
هەروەها گەلێک زانا لە ئیتاڵیا و ئینگلتەرا و روسیا، لەم بوارەدا لە هەوڵ و تێکۆشاندا بوون و بەردەوام بوون لەسەر هاوکاریکردنی یەکدی، لەپێناو پەرەپێدان و گۆڕانکاری و باشترکردنی وردبینەکان، تا گەیاندنیانە ئەو وردبینە نایاب و پێشکەوتوانەی کە ئێستا بەکاردەهێنرێن و پێیان دەڵێن (میکرۆسکۆب).

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| وردبین | : | میکرۆسکۆب |
| هاوێنە | : | نەینۆک |
| بۆچوون | : | بیرورا |
| دەربخات | : | پیشانبدات |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. وردبین چییە و چۆن داهێنرا؟

٢. سوودەکانی وردبین بژمێرە؟

٣. لیڤنهۆک کێیە و چی داهێنا؟

٤. میکرۆب لە چ ئاوێکدا زۆرە؟

## ڕاهێنان (٢)

پیاو / پیاوان

تۆش ئەم وشانەی خوارەوە وەک نموونەی سەرەوە لێبکە:

کوڕ

کچ

دار

کەو

منداڵ

## ڕاهێنان (٣)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. لەسەدەی یازدەدا ................ دروستکرا.

٢. بۆ یەکەمجار لە ئیتاڵیا ................ دروستکرا.

٣. یەکەم ................ بە ڕێگای ڕێکەوت دۆزرایەوە.

٤. لیڤنهۆکی زانای هۆڵەندی توانی ................ سیستەمی وردبینی دابهێنێت.

## چالاکی

مامۆستا قوتابییان بباتە تاقیگەی قوتابخانەکەیان و (وردبین- هاوێنە - چاوێلکەی هاوێنەدار- ئاوێنە) پیشانی قوتابییان بدات و چۆنیەتی بەکارهێنان و سوودەکانی لەلایەن مامۆستای زانستەوە بۆ قوتابییان ڕوون بکرێتەوە.

# جەژنی دایک



لە بیست و یەکی مانگی ئاداری هەموو ساڵێک، کە هاوکاتە لەگەڵ یەکەم ڕۆژی ساڵی تازەی کوردی و جەژنی نـەورۆز، گەلانی جیهان یادی ڕۆژی دایک دەکەنەوە، ئەوە جەژنی تۆیە، ئەی دایکی خۆشەویست.

قوتابخانەکەی ئێمەش لەم ڕۆژەدا بەشداری ئەم ئاهەنگە دەکات و بە گوڵی جوان و ئاڵا و نیگاری ڕەنگاو ڕەنگ دەڕازێنرێتەوە.

قوتابییەکان بە گۆرانی و مۆسیقای خۆش و شانۆگەری و پێشکەشکردنی دیاری نایاب بۆ دایکان، دڵشادی خۆیان دەردەبڕن.

ئەمە هەمووی بۆ تۆیە، ئەی دایکی خۆشەویست، من هەرگیز خۆشەویستی تۆم لەبیر ناچێتەوە. هەمیشە دڵم پڕە لە خۆشەویستی و ڕێزو سۆز بۆ تۆو ئامۆژگاریەکانت لە گوێم دەزرنگێتەوە ڕاستی و دڵپاکی و ئازایەتی و ڕێزگرتنی خـەڵک و خۆشەویستی نیشتمان و نەتەوە و خۆ بەختکردنی لێ فێردەبم. ئەمڕۆ جەژنی هەموو دایکێکە، کە بەو شێوەیە ڕۆڵەی نیشتمان پەروەرو قارەمانیان هێناوەتە دنیاوە.

ئێمەش لەم بۆنەیەدا چەپکێک گوڵی ڕازاوەت پێشکەش دەکەین.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
| --- | --- | --- |
| هەرگیز | : | هیچ کاتێک |
| هەمیشە | : | هەموو دەم |
| خۆبەختکردن | : | گیان بە قوربانکردنی نیشتمان |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. کەی لە هەموو جیهاندا جەژنی دایک دەگێڕدرێت؟
٢. دەتوانین باسی ئاهەنگ گێڕانی جەژنی دایک بکەین، چۆن لە قوتابخانەکەتدا ڕێکخرا؟
٣. دایک لەگەڵمان زۆر ماندوو دەبێت، چۆن چاکەی ئەو ماندووبوونەی دەدەینەوە؟

## ڕاهێنان (٢)

(پێنج دێڕ لەسەر دایک بنووسە)

# کۆمپیــــــوتەر




کۆمپیوتەر، کۆمپیوتەر
دانیشە لام، بەرامبەر
دانیشە و لێم بڕوانە
ئیشوکارم چەند جوانە
عەقڵێکی گەورە و پڕم
وەك دارستانی چڕم
ئامێرێکی هەستیارم
هەڵە ناکەم لە کارم
من گەنجینەی زانیاریم
بۆتان مایەی وشیاریم
وەرە بەکارم بێنە
زانیاریم لێ دەربێنە

(بەرزان ئەحمەد)

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| بڕوانە | : | سەیرکە |
| چڕ | : | پڕ |
| گەنجینە | : | کۆگا |
| مایە | : | هۆ |

# شێخ سەعیدی پیران



شێخ سەعید کوڕی شێخ مەحمودی (کلّدار) ە لە گوندی پیران لە سەرووی دیاربەکر لە ساڵی ١٨٦٨ز لە دایکبووە، هەر زوو هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەری لە دڵیدا چەکەرەی کردووە. لە ئەنجامی جەنگی جیهانی یەکەم و بێبەشکردنی کورد لە ماف و خاکەکەی چەندین ڕاپەڕین و شۆڕشی چەکداری لە کوردستان سەریان هەڵداوە. یەکێک لەو شۆڕشانە بە ڕابەرایەتی شێخ سەعیدی پیران بوو لە باکوری کوردستان لە ئەنجامی جەور وستەمی کەمالیەکان بە مەبەستی بەدیهێنانی مافەکانی نەتەوەی کورد لە نەورۆزی ساڵی ١٩٢٥ سەرکردە کوردەکان بە ڕابەرایەتی شێخ سەعید بڕیاریاندا، کە دەست بە شۆڕش بکەن، سوپای دەوڵەتی تورکیا هێرشی کردە سەریان و تێک شکا.

ماوەیەکی کەم شۆرشگێڕان توانییان چەندین شاری گەورەی بە شاری (دیاربەکر) ەوە ئازادبکەن، بەڵام نا بەرامبەری و نا هاوسەنگی هێز وایکرد لە بەرژەوەندی سوپای دەوڵەتی تورک وەستایەوە و کۆتایی بە شەڕەکان هات و لە ئەنجامدا شێخ سەعید و دکتۆر فوئاد و هاوڕێکانیان بە دیل گیران و لە ساڵی ١٩٢٥ لە دیاربەکر لە سێدارە دران.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| چەکەرەی کرد | : | شین بوو |
| جەورو ستەم | : | زوڵم و زۆرداری |
| ڕابەرایەتی | : | سەرۆکایەتی |

## ڕاهێنان

وەڵامی ڕاست بۆ ئەمانەی خوارەوە هەڵبژێرە:

١. شۆڕشی شێخ سەعید لە ساڵی ................ بەرپابوو.
(١٨٢٥ - ١٩٢٥ - ١٧٢٥)

٢. شێخ سەعید خەڵکی کوردستانی ................ بوو.
(باشوور، ڕۆژهەڵات، باکوور)

## چالاکی (١)

هۆکاری هەڵگیرسانی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران چی بوو؟

## چالاکی (٢)

ناوی سێ لە شۆڕشەکانی ڕزگاری خوازی کورد بنووسە.

# ژیریی کەڵەشێرێک



ڕێویەک بە گوندێک تێدەپەڕێت، لە نزیک گوندەکەوە، چاوی بە کەڵەشێرێک دەکەوێت، کە لەناو خۆڵ چینەی دەکرد، بۆ دان دەگەڕا بیخوات.

ڕێوی هاتە پێش و نزیک کەوتەوە چاکوچۆنی لە کەڵەشێر کرد و گوتی: کاکەی کەڵەشێر، دێتە بیرم، کە باوکت دەنگی زۆر خۆشبوو، هەر چەندە بەم گوندە دەڕۆیشتم، گوێم لە دەنگی دەبوو، بە دەنگە خۆشەکەی دڵم دەکرایەوە.

کەڵەشێرەکە گوتی: دەنگی منیش خۆشە و لە دەنگی باوکم هیچی کەمتر نییە، پاشان هەر دوو چاوی نوقاند و باڵەکانی لێکداو دەستیکرد بەقووقە قووق.

ڕێوییەکە ئەمەی بە هەلزانی و پەلاماری دا، گرتی و هەڵهات.

سەگەلی گوند، کە بەمەیان زانی شوێنی کەوتن.

کەڵەشێرەکە بەڕێوییەکەی گوت:

ئەگەر دەتەوێت لەم سەگانە ڕزگارت بێت، ئەوا پێیان بڵێ، کە ئەم کەڵەشێرە، کەڵەشێری گوندی ئێوە نییە، هی گوندێکی دیکەیە.
ڕێوییەکە ویستی ئەمە بە سەگەکان بڵێت و دەمی کردەوە:
کەڵەشێر لە دەمی ڕێوی دەرپەڕی و خۆی گەیاندە لای سەگەکان، ڕێوی بە لەدەستچوونی کەڵەشێرەکە، وتی: یاخوا ئەو دەمە لەکاتی خۆی نەکرێتەوە، لەگۆ بکەوێت. کەڵەشێرەکەش گوتی، یاخوا ئەو چاوەی بێ ئاگا بنووقێت هەر کوێر بێت...

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| دان | : | دانەوێڵە، گەنم، جۆ |
| گوند | : | ئاوایی، لادێ، دێ |
| چینەکردن | : | گەڕان بەدوای خواردن لەناو خوڵ |
| ڕەتدەبووم | : | تێدەپەڕیم |
| هەل | : | دەرفەت |
| دەم | : | زار، دەو |
| خۆڵ | : | گڵ |
| لەگۆ بکەوێت | : | لە وتن کەوێت |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. ڕێوی حەز لە چی دەکات؟

٢. سەگەلی ئاوایی بۆچی شوێن ڕێوی کەوتن؟

٣. ڕێوی کە ویستی فێڵ لە کەڵەشێرەکە بکات، چی پێگوت؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم وشانە بکە بە بڕگە:

ناسک :

زیرەک :

هاوین :

هەرمێ :

هاوار :

## ڕاهێنان (٣)

١. کەڵەشێرەکە هــەردوو چـاوی ............... و باڵەکانی ................و دەستیکرد ..................

٢. کەڵەشێرەکە گـوتـی، یـاخـوا ئـەو چـاوەی .............. هەر.............

## چالاکی

(چی لەم وانەیەوە فێربوویت)

..........................................................

..........................................................

..........................................................

......................... .

# یاسای دارستان



بەیانییەکی خۆشی سەرەتایی بەهار.. تازە خۆر لە کەلێنی چرۆ و چڵە ناسک و کۆرپەکانی دارە بەرزەکانەوە بەر زەوی دارستانەکە دەکەوت، ئاژەڵ و باڵندەکان بەوپەڕی گورج و گۆڵیەوە بەدوای کاری خۆیان دەگەڕان و بە گەشبینیەکی زۆرەوە دەیانڕوانییە هەڵاتنی خۆر.

ورچ بە لەخۆبایی بوونێکی زۆرەوە بەناو دارستانەکەدا، دەڕۆیشت بۆ دەرخستنی هێز و توانا و دەسەڵاتی خۆی ئەوەندەی دەستی دەگەیشتێ لقە ناسکەکانی درەختەکانی دەشکاند و فڕێی دەدانە سەر زەوی، لە دوورەوە مەیمونێک لەسەر درەختێکەوە چاوی بەم رەفتارە ناشیرینەی ورچ کەوت و زۆری پێ ناخۆشبوو.. بۆیە بە یەک دوو باز خۆی گەیاندە ورچەکە، بە بزەیەکەوە بە ورچەکەی گوت:

ورچەگیان، توخوا وا لەو لقانە مەکە، زۆر گوناهت دەگاتێ چونکە زیان بە دارەکان و بە دارستانەکە دەگەیەنیت، ئەمە کردەوەیەکی ناشیرینە وازی لێبهێنە.

* گۆڤاری ژینوار ژمارە (٦) بەهار ڕەشید

ورچ به تەوسێکەوە سەرێکی بۆ لارکردەوە و هیچ گوێی بە قسەکانی نەدا و خەریکی کاری خۆی بوو، بۆیە کە مەیموونەکە زانی بە قسەی ناکات دەستی کرد بە هەڵبەز و دابەز و بە دەنگی بەرز کەوتە قیژە قیژ بە جۆرێک ئاژەڵەکانی ناو دارستانەکە لە دوور و نزیک گوێیان لە دەنگ و قیژە و هاوار هاواری مەیموونەکە بوو، هەموو زانیان کە شتێک قەوماوە به تاک وکۆ بەلۆقە و ڕاکردن و فڕین و بازدان خۆیان گەیاندە لای مەیموون و هەواڵەکەیان بە شێریش گەیاند، شێرەکە گەیشتە لای مەیموون و ورچ، ڕوویکردە ورچ و بە تووڕەییەوە پێیگوت:

بە پێی یاسای دارستان، ورچ تاوانبارە... سزاکەشی دەبێت چەند نەمامێکی بێ وێنە و بەردار لەم دارستانەدا بڕوێنی و ڕۆژانە چاودێرییان بکات تا گەورە دەبن و لە خەم دەرەخسێن.

هەروەها دەبێت داوای لێبوردنیش لە ئاژەڵ و باڵندەکانی ناو دارستانەکە بکات و بەڵێنیش بدات، کە هەرگیز کاری وا نابەجێ دووبارە نەکاتەوە.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| کەلێن | : | نێوان |
| کۆرپە | : | منداڵی تازەبوو |
| گەشبینی | : | دڵخۆشی |
| لەخۆبایی | : | بە فیزەوە |
| ڕەفتار | : | کردەوە |
| لە خەم دەرەخسێت: | | گەورە دەبێت. |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. دەتوانیت باسی ئەو بەیانییە بەهارییە بکەیت؟

٢. ئاژەڵ و باڵندەکان چاوەڕوانی چی بوون؟

٣. ورچەکە خەریکی چی بوو لە دارستانەکەدا؟

٤. مەیمونەکە چی بەورچەکە گوت؟

## ڕاهێنان (٢)

بە وشەی گونجاو ئەم بۆشاییانە پڕ بکەوە:

١. ئاژەڵ و باڵندەکان ................. بەدوای کاری .................

٢. ورچەکە ................. دەستی دەگەیشتە ................. دەیشکاندنەوە.

٣. مەیموونەکە بە ................. گوت .................

٤. سزای ورچەکە ................. چاودێری بکات .................

## چالاکی

مامۆستا باسی پەیڕەوکردنی هەندێک لەو یاسایانە بکات کە پێویستە خوێندکار پێی بێت پابەندلە قوتابخانە.

# وانەیەک بۆ منداڵان

مناڵەکان!

ئەی برسییە ژین تاڵەکان

لەسەر سینگە نەوتاوییەکەی، بابەگوڕ گوڕ

نێزیک .. تاقگەکەی سەرەو ژووری، زێرینی گڕ...

گڵکۆیەکی بچکۆڵەم دی.

لێی نووسرابوو:

((ئا لێرەدا مناڵێکی، چاوگەشی کورد لە برسان.. مرد!))



<< عەبدوڵڵا پەشێو >>

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| گڕ | : ئاگر |
| گلکۆ | : گۆڕ |
| پەشێو | : شێواو |



# بەسەرهاتی مشکان



کۆمەڵە مشکێک لەماڵێکدا دەژیان، گیریان بەدەست پشیلەیەکەوە خواردبوو، پشیلەکە نەیدەهێشت هیچ شتێک بەرن، بۆیە مشکەکان کەوتنە خۆیان کۆبوونەوەیەکیان بەست.. لەو کۆبونەوەیەدا هەر مشکەو پێشنیازی خۆی دەرکرد، تا لەم پشیلەیە ڕزگاریان بێت و شتێک بکەن بۆ ئەوەی هەر پشیلەکە دەرکەوت ئەوان بەئاگا بێن، یەکێک لە مشکەکان گوتی: (من وا بەباشی دەزانم کە زەنگوڵەیەک بکەینە ملی پشیلەکە) بۆ ئەوەی هەر کە پشیلەکە جوڵایەوە مشکەکان بەئاگا بێنەوە، ئەم پێشنیازە لای زۆربەی مشکەکان پەسەندو جوان بوو، بەڵام مشکێکی بچووک لەولاوە دانیشتبوو.

وتی: باشە کێ دەتوانێت زەنگوڵەکە بکاتە ملی پشیلەکە، ئەم پرسیارە هەموو مشکەکانی بێدەنگ کرد، چونکە کەس نەیتوانی بەم کارە هەڵبستێت، بۆیە کۆبوونەوەکەیان بێ ئەنجام کۆتایی هات.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| نەخشە | : ڕێگا |
| بیرۆکە | : بیرکردنەوە |
| خوێن گەرم | : ئازا، ئازا و بەجەرگ |
| زەنگوڵە | : زەنگی بچووک |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١ . مشکەکان بۆچی کۆبوونەوە؟

٢ . مشک لە چی دەترسێ؟

٣ . مشکان بڕیاری چییان دا؟

٤ .مشکە بچووکەکە چی گوت؟

## ڕاهێنان (٢)

شێر، پڵنگ      بەهێز

شێر لە پڵنگ بەهێزترە

تۆش ئەمانەی خوارەوە وەکو نموونەکەی سەرەوەیان لێبکە:

ئازاد، نەوزاد      زیرەک

.................

مەتین، سەفین      بڵند

.................

فورات، دیجلە      درێژ

.................

بەغدا، هەولێر      گەورە

.................

هاڤین، بەهار      گەرم

.................

## چالاکی (١)

١. کام لەم گیاندارانە بۆ سوارییە؟

( ئەسپ - چێڵ - مشك )

٢. کێ پەز لە گورگ دەپارێزێت؟

( مرۆڤ - ڕێوی - پڵنگ )

٣. کام لەم گیاندارانە شیر دەرە؟
(کەو- پەز- قان)
٤. کام لەم گیاندارانە نافرێت؟
(کۆتر- پشیلە - قەل)

## چالاکی (٢)

دەنووسێت- دەخۆم — کەوت- هات- خوارد- نووست- کڕی.
ئەمانەی سەرەوە پێیان دەوترێت (کار) چونکە کردەوەیەک دەداتە پاڵ کەسێک یان شتێک. لە کاتێکی دیاریکراودا.
تۆش پێنج کار لەو جۆرانە بنووسە:
١.
٢.
٣.
٤.
٥.

# هەنگ و گوڵ



ڕۆژێک هەنگێک لەناو باخچەیەکی گوڵاندا خەریکی مژینی شیلەی گوڵێک بوو، لەناکاو گوڵەکە پرسیاری لێکرد و گوتی:

ئەی هەنگی جوان تۆ بۆچی شیلەی من دەمژی؟ هەنگەکە لە وەڵامدا گوتی: بۆ دروستکردنی هەنگوین.

گوڵەکە گوتی: هەنگوین چییە؟

هەنگەکە لە وەڵامدا گوتی: شیرینیەکی زۆر بەتام و سوودبەخشە بۆ مرۆڤ و چارەسەری زۆربەی نەخۆشییەکان دەکات و هیچ زیانێکی پێناگەیەنێت. گوڵەکەش پاش کەمێک بە هەنگەکەی گوت:

کەواتە ئەگەر شیلەی من نەبێت تۆ ناتوانیت هەنگوین دروست بکەیت.

هەنگەکە لە وەڵامدا گوتی:

بەڵێ گوڵی جوان.. ئەگەر شیلەکەی تۆ نەبوایە منیش نەم دەتوانی هەنگوین دروستبکەم، گوڵەکەش زۆر دڵخۆش بوو بە هەنگەکەی گوت: کەواتە شیلەکەی منیش بە سوودە؟ هەنگەکە گوتی بەڵێ بێگومان.

گوڵەکە گوتی: کەواتە تۆ نزیکترین هاوڕێی دڵسۆز و خۆشەویستی.

هەنگەکەش لە وەڵامدا گوتی:

بەڵێ گوڵی جوان و بۆن خۆش تۆ هەمیشە هاوڕێی منی.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| هەنگ | مێش هەنگوین |
| هەمیشە | هەمووکات، هەردەم |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. هەنگ چی دروستدەکات؟
٢. سوودی هەنگوین چییە؟
٣. گوڵەکە چی بە هەنگ گوت؟
٤. گوڵەکە پرسیاری لە کێ کرد؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. هەنگەکە گوتی ............... منیش بەسوودە.
٢. گوڵەکە زۆر ............... .
٣. هەنگ گوتی: بەڵێ گوڵی جوان و ............... تۆ هەمیشە هاوڕێی منی.
٤. ئەگەر گوڵ نیت ............... مەبە.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم ناوانە بخەرە ڕستەوە:

(ئازاد، شێر، سێو، بەرد، دهۆک)

# گۆرانی دەنکە گەنم

ئەی خوای گەردوونە بەرزە!
دەغڵەکەم بپارێزە
لە سن و کوللە و تەرزە
هی تۆیە و من
نەک هی دوژمن
دەنکە گەنم

* * *



دەغڵم وەک ئاڵتوون زەردە...
وەرزێڕ! داس لە هەسان دە!
خۆت ئاسایی تەکان دە...
مەڵۆم بۆ لە خەرمان دە...
خەرمانی سوور
وەک کۆگای نوور
دەنکە گەنم

(گۆران)

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| سن | : جۆرێکە لە مێروو |
| ئاڵتون | : زێر |
| تەکان | : جووڵە |
| مەلۆم | : مەرۆک ، سواڵە |

## چالاکی

مامۆستا باس لەو خواردنانە بکات کە لە گەنم دروست دەکرێن

# گورگێکی سپڵە



ڕۆژێکیان کەروێشکێک بە نزیک گردێکدا تێدەپەڕی گوێی لە دەنگێک بوو داوای یارمەتی دەکرد، کە نزیک بووەوە، بینی گورگێک کەوتۆتە ژێر کەڵەکە بەردێکەوە، کەروێشک دوای هەوڵێکی زۆر بەردەکانی لابرد و گورگەکەی ڕزگارکرد، کەچی گورگەکە خۆی بۆ کەروێشکەکە هەڵدا و گرتی. کەروێشک وتی: کەی ئەمە ڕاستە، یەکێ بخۆی کە یارمەتی داوی، ئەمە پاداشتی چاکەکەمە! با بچین بۆ لای مراوییە قەڵەوەکە، ئەو ناوبژیوانمان بکات.

گورگەکە وتی: باشە بەڵام گەر شتێکی وت بە دڵم نەبوو، ئەوا تخۆم!!

هەردووکیان چوونە لای مراوی و ڕووداوەکەیان بۆ گێڕایەوەدە

مراوییەکە وتی: تا بەچاوی خۆم ڕووداوەکە نەبینم هیچ ناڵێم.

ئینجا بە گورگەکەی وت: تۆ پاڵکەوە با بەردەکان بخەینەوە سەر پشتت، کەروێشک تۆ بڕۆرەوە شوێنی خۆت، ئا بەم شێوەیە بەردەکانیان خستە سەر پشتی گورگەکە وقۆڵیانکرد بە قۆڵی یەکداو بە گورگەکەیان وت:

تۆش بۆ خۆت لە ژێر ئەم بەردانە بمێنەرەوە و چاوەڕێی یەکێکی دیکە بکە با یارمەتیت بدات.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| گردێک | : | تەپۆڵکەیەکی بەرز |
| کەڵەکە | : | ئەو شوێنەی بە بەرد بەرز دەکرێتەوە. |
| ناوبژیوان | : | ناوبژیکەر |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. کەروێشکەکە گوێی لە دەنگی چی بوو؟

٢. گورگەکە چی بەسەرهاتبوو؟

٣. کەروێشک چی بۆ گورگەکە کرد؟

٤. پاداشی گورگەکە چی بوو بەرامبەر کەروێشک؟

٥. مراوییەکە چی پێ گوتن؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم وشانە بخەرە ڕستەوە:

(یارمەتی، بەرد، پاداشت، مراوی، چاکە).

## چالاکی

خوێندکاری خۆشەویست: ناوی پێنج گیانداری دڕندە بڵێ.

# كۆماری كوردستان



پێشەوا قازی محەمەد

مەهاباد یەكێكە لە شارە دڵگیر و خۆشەویستەكانی كوردستان، ئەو شارە كەوتۆتە ناوچەی (موكریان) لە ڕۆژهەڵاتی كوردستان.

مەهاباد شوێنێكی تایبەتی لە دڵ و دەروونی ئێمەی كورد هەیە، چونكە سەردەمێك پایتەختی یەكەمین كۆماری كوردستان بووە.

ئەو كۆمارە لە٢٢ی كانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ی زایینی دامەزراوە لە كۆبوونەوەیەكی جەماوەریی زیاتر لە (بیست) هەزار كەس لە گۆڕەپانی (چوار چرا) لە شاری مەهاباد ڕاگەیانرا و پێشەوا قازی محەمەد بە سەرۆكی ئەو كۆمارە هەڵبژێردرا.

پێشەوا قازی محەمەد لە شوێنێكی بەرز كە بەتایبەتی بۆ ئەو بۆنەیە دروستكرابوو لەبەردەم جەماوەر وەستا و گوتی: وا ئەمڕۆ گەلی كورد توانی كۆمارێكی خۆیی پێكبهێنێت تا وەک گەلێكی سەربەخۆ لە خاكی خۆی بە ئازادی بژی.

دوای ئەوەی قازی محەمەد بە سەركۆمار هاتە هەڵبژاردن، ئەویش كەوتە ڕاوێژكردن بۆ پێكهێنانی ئەنجوومەنی وەزیران، كە لە سێزدە وەزیر پێكهاتبوو.

دوای پێکهێنانی دامو دەزگاکانی، قازی محەمەدی سەرکۆمار لەبەردەم ئەنجومەن سوێندی یاسایی خوارد و گوتی: (سوێند دەخۆم بە خواو قورئانی پیرۆز، بە نیشتمانی شەڕافەتی قەومی کورد و بە ئاڵای پڕ ئیفتخاری کورد، تا دوا هەناسەی ژیانم و دوا تنۆکی خوێنم بە گیان و بە ماڵ لە ڕێگەی مانەوەی کورد و بەرزکردنەوەی ئەم ئاڵایە، کە مایەی شانازی هەموو کوردێکە، کۆشش بکەم و دوا نەکەوم.. ).کۆماری کوردستان گرنگییەکی زۆری بە بواری پەروەردە و فێرکردن و ڕۆشنبیری دا، لە ماوەی نزیک لە ساڵێک چەندین ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی دەرچوو. شایانی باسە هەر لە سەردەمی ئەم کۆمارە یەکەمین گۆڤاری منداڵان بە ناوی (گڕوگاڵی منداڵانی کورد) دەرچووو و سێ ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە.

بە داخەوە دوژمنانی کورد توانیان ئەو کۆمارە ساوایە لەناو ببەن، کە بەڕاستی بووبووە مایەی شانازی و جێگەی هیواو و ئاواتی هەموو کوردێکی دڵسۆز، پێشەوا قازی محەمەدی سەرکۆمار و چەندین هاوڕێ و هاوسەنگەری لە سێدارە بدەن.

قازی محەمەد وەک قارەمانێکی بێ وێنە لەبەردەم پەتی سێدارە ڕووبەڕووی جەلادەکان وەستا و نەیهێشت چاوی ببەستنەوە، بەڵکو بەو پەڕی دڵگەرمیەوە و شۆڕشگێڕییەوە گوتی:

(من شەرمەندەنیم لە ئاست نەتەوە و نیشتمانی خۆشەویستم چاوم ببەستن، من دەمەوێ لە ئاخرین دەقیقەی ژیانم بە سەربەرزییەوە لە نیشتمانی جوان و خۆشەویستم بڕوانم، من کوڕی ڕاستی نەتەوەکەم بووم، بژی نەتەوەی کورد. بژی ڕزگاری کوردستان).

# واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| ڕۆژهەڵاتی کوردستان | : | کوردستانی ئێران |
| ڕاوێژکردن | : | پرس پێکردن |
| شەرمەندە | : | شەرمەزار |
| خەبات | : | تێکۆشان |
| ڕاگەیانرا | : | هاتە ڕاگهاندن |
| هەلبژێرا | : | هاتە هەڵبژاردن |
| شایانی باسە | : | هەژی گۆتنێیە |
| لە عاست | : | لە ئاست، لە بەرامبەر، ل هەمبەر |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. لەبەرچی شاری مەهاباد شوێنێکی تایبەتی لە دڵ و دەروونماندا هەیە؟

٢. ئەو سوێندەی قازی محەمەد لەبەردەم ئەنجومەنی وەزیراندا خواردی، چی بوو؟

٣. کۆتایی ژیانی قازی محەمەد بە چ شێوەیەک بوو؟

## راهێنان (٢)

ڕاستی و هەڵەی ئەم ڕستانە پیشانبدە بە نووسینی ژمارەی ڕستەکە لە خانەکانی (ڕاست) و (هەڵە):

١. کۆماری کوردستان لە ساڵی ١٩٤٧ز دامەزرا.

٢. گڕوگاڵی منداڵانی کورد یەکەم گۆڤاری منداڵانی کورد بوو.

٣. ئەنجومەنی وەزیرانی کۆماری کوردستان لە سێزدە وەزیر پێکهاتبوو.

٤. کۆماری کوردستان لە کوردستانی عێراق دامەزرا.

| ڕاست | هەڵە |
|---|---|
| | |
| | |
| | |
| | |

## راهێنان (٣)

ئەم وشانە بە هێڵ بە یەکبگەیەنە:

| | |
|---|---|
| شاخی | تاریک |
| زستانی | سپی |
| شەوی | زیرەک |
| کۆتری | بەرز |
| قوتابی | سارد |

# باخی گشتی



وەرزی بەهار، وەرزی گەشت و گوزارە، کۆمەڵەی گەشت و گوزاری قوتابخانە، لە ڕۆژێکی بەهار بڕیاری گەشتێکی بۆ باخی گشتی دا. چی پێویست بوو، بۆ ئەم گەشتە، وەک خواردن و کەرەسەی یاری ئامادەیان دەکرد. لەو ڕۆژەدا قوتابییەکان بە بەرگی کوردی جوانەوە ئامادەبوون و بە پاس، بەرەو باخی گشتی کەوتنە ڕێ.

بە گەیشتنیان، لەبەردەم باخەکە دابەزین و بەخۆشی و بەدەم یاریکردن و گۆرانی گوتنەوە، بەناو باخەکە بڵاوبوونەوە.

دڵخۆش بوون بە دیمەنی سەوزی گەڵای دارەکان و گوڵە باخە ڕەنگاو ڕەنگەکان، دەستیان کرد بە گۆرانی و سەماو هەڵپەڕکێ و یاریکردن، کەژاڵ چووە نزیک گوڵە باخێکی جوانەوە کە تازە خونچەی ناسکی دەرکردبوو.

چەند کرمێکی سەوزی وردی بەسەر خونچەکانەوە بەدیکرد، کە خەریکی خواردنی خونچەکە بوون و ڕێگەیان لە گەورەبوون و گەشەکردنی دەگرت. لەم کاتەدا بە بیری هاتەوە، کە لەوانەی زانست خوێندوویەتی، ڕووەک و گوڵ دوژمنیان زۆرە، وەک ئەو کرمە وردانەی سەر خونچەکان.

کەژاڵ سەری هەڵبڕی، براکەی بینی، خەریك بوو، گوڵەباخێک لێبکاتەوە.

زوو فریاکەوت و پێی گوت: نەکەی ئەو گوڵەباخە لێبکەیتەوە، چونکە ئەو گوڵانە هی ئێمە نین دیمەنی باخەکە و شارەکەمان جوان دەکەن و بۆنی خۆش بلاو دەکەنەوە و خۆشی بە دڵ و بە چاو دەبەخشن، پێویستە خزمەتیان بکەین و بیان پارێزین.

براکەی پەشیمان بووەوە و داوای لێبوردنی کرد، بەڵێنی دایە، کە جارێکی دی بە مەبەستی لێکردنەوەیان دەست بۆ گوڵ نەبات.

پاش یاریکردن و گەڕان و کاتێکی خۆش بەسەر بردن، قوتابییەکان کۆبوونەوە، خۆیان بۆ نانی نیوەڕۆ ئامادەکرد.

دوای پشوودان و نانخواردن، قوتابییەکان جارێکی دیکە، تا نزیکی ئێوارە دەستیانکرد بە سازدانی چەند چالاکییەکی شانۆیی و گۆرانی و هەڵپەڕکێ وپێشبڕکێ، بەر لە خۆر ئاوابوون، قوتابییەکان بە خۆشی و شادییەوە بەرەو ماڵ گەڕانەوە.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| گەشت و گوزار | : | سەیران |
| کەرەستە | : | کەلوپەلی پێویست |
| خونچە | : | بشکوژ، شکۆفە |
| بڕیار | : | فەرمان |
| پەشیمان | : | ژێوان |
| لێبووردن | : | لێخۆشبوون |
| بەڵێن | : | پەیمان |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. بەهار بۆچی وەرزی گەشت و گوزارە؟
٢. جیاوازی نێوان باخی گشتی و باخچەی ماڵەکەتان چییە؟
٣. کە دەچیت بۆ دەشت و دەر بۆ سەیران، ئەو ڕۆژە چۆن بەسەردەبەیت؟

# راهێنان (٢)

وشەی گونجاو بۆ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە دابنێ:

(کەژاڵ براکەی بینی، خەریکە ................ لێبکاتەوە وپێی گوت:

ئەو ................ لێنەکەیتەوە، چونکە هی ................

نین دیمەنی ................ و شارەکەمان ................

دەکات و پێویستە ................ بکەین )

پاک ڕاگرتنی شوێنە گشتییەکان

خۆشەویستییە بۆ خاک و نەتەوە

# خۆراكی بە سوود




مامۆستا: كچ و كوڕە خۆشەویستەكانم كێ دەزانێت خۆراک سوودی بۆ مرۆڤ چییە؟

شەونم: مامۆستای هێژا، خۆراكی بەسوود هۆكارێكی گرنگە بۆ گەشەكردنی لەشی مرۆڤ و گەورەبوونی، بەتایبەتی لە زارۆک و منداڵاندا.

مامۆستا: كام جۆرە خۆراک بۆ منداڵان بە سوودە؟

ئاشتی: ئەو خۆراكانەی كە پرۆتینیان تێدایە وەكو گۆشتی ماسی.

ئازاد: مامۆستا، بێجگە لەمانە، شیروماست و هێلكە و نیسک و نۆک و هەندێک جۆرە سەوزەش پرۆتینیان تێدایە.

مامۆستا: ئافەرین بۆ ئێوە ڕۆڵە خۆشەویستەكانم.

با منیش هەندێک زانیاری دیكەتان لە بارەی خۆراكی بەسوود بدەمێ.

لەشی مرۆڤ پێویستی بە گەڵێک جۆرە كانزا هەیە كە لە سپییایی و سەوزەدا هەن وەک كانزای كالسیۆم و پۆتاسیۆم و فۆسفات و كلۆرید و گەلێكی دیكە.

هەروەها ڕۆڵە خۆشەویستەکانم ڤیتامینیش بۆ لەشی مرۆڤ بەسوودە.

هەردی: مامۆستا گیان ڤیتامین چۆن دەست دەکەوێت؟

مامۆستا: ڤیتامین لە میوە و سەوزەی تازە هەیە.

قوتابییان: مامۆستا گیان پڕ بە دڵ سوپاست دەکەین بۆ ئەم زانیارییە بە نرخانەت لە بابەت خۆراکی بەسوود.

## واتای وشەکان



| وشە | واتا |
|---|---|
| خۆراک | : خواردن |
| بەسوود | : بەکەڵک |
| هۆکار | : هۆ |
| گرنگ | : ب پویتە |
| گەشەکردن | : گەورەبوون |
| سپییایی | : شیرەمەنی |



# ڕاهێنان

خوێندكارانی خۆشەویست:

خۆراكە بە سوودەكان بۆ گەشەكردن و گەورەبوونی لەشی مرۆڤ و پاراستنی لە نەخۆشی ئەمانەن:

١. پرۆتین، كە لە .............، .............، .............، .............دا هەیە.

٢. ڤیتامین، كە لە .............، ............. ی تازەدا هەیە.

٣. كانزاكان، وەک .............، .............، .............، .............

# چالاكی (١)

پێچەوانەی ئەم وشانە وەكو نموونەی **خوارەمە** لە تێنووسەكەت بنووسە:

بەسوود × بێ سوود

بە توانا × .............

بەهێز × .............

بەبایەخ × .............

بەدەسەڵات × .............

بەدەنگ × .............

## چالاکی (٢)

ئەمانە بخوێنەوە ئینجا بۆشاییەکان تەواو بکە:

| | |
|---|---|
| خواردن | خواردنەوە |
| بڕین | بڕینەوە |
| هاتن | ............. |
| بردن | ............. |
| گەڕان | ............. |
| مان | ............. |
| کردن | ............. |
| شتن | ............. |
| نووسین | ............. |

## چالاکی (٣)

مامۆستا بەکورتی باس لە پێکهاتە بنەڕەتییەکانی خۆراک بکات.

# جوانی بەهار



ئاوی قەڵبەزەی سپی و ڕەنگاوڕەنگ
وەختێ کە تاڤگە دێتە پێکەنیـــــن
بووکی بەهاری جوانــــــــی ڕازاوە
لەسەر لووتکەی شاخ تاجی زەردەپەڕ
لەسەر کەناری چەمی پڕ نەغمـــــە
بەرگی داماڵی سەوزی ئاودامـــــان
وردە شەپۆلی جۆگەلەی بـــــڵاو
وەکو فریشتە گوڵی هەڵوەریـــــو
ئەڕۆن بەرەو خوار بە پشتە مەلـــــە

لە گەرووی کەژا ئەیکا بە ئاهەنــــگ
مەلانی بزێو دێنە هەڵپـــــــــەڕین
لە کوردستانا خێمەی هەڵـــــــداوە
پرشنگ ئەهاوێ بۆناو ئاوی کـــــەڕ
ئەو خونچە سوورەی ناسک و نەرمــە
خۆی شت بە قەترەی بەفراوی کوێستان
ختووکەی بەردە لە کەناری ئـــــاو
لەسەر سنگی ناو جۆگەی وەکو زیـــو
ئەپژێتە دەمیان تیشکی ئەو کەلــــە

(کامەران)

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| قەڵبەزە | : تاڤگە، سوولاوک |
| کەژ | : چیا، کێو، شاخ |
| زەردەپەڕ | : زەردەی خۆرئاوا |
| ئاوی کەڕ | : مەبەست لە هاژە و دەنگ و هەرای زۆری ئاوەکەیە |
| چەم | : ڕووباری بچووک |
| نەغمە | : ئاواز |
| ئاودامان | : سەرتاپێ |
| شت | : شۆرد |
| ختووکە | : هێنانە پێکەنین |
| کەنار | : لێوار، ڕۆخ، قەراغ |
| کەل | : لێرەدا مەبەست لە نێوان لووتکە شاخەکانە. |

## ڕاهێنان

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. لە پارێزگای هەولێر تاڤگەیەکی ناودار هەیە، ناوی چییە؟
٢. تاڤگەی (سۆلاڤ) لە کام پارێزگای کوردستانە؟
٣. ناوی هیچ تاڤگەیەکی ترت بیستووە؟
٤. ناوی پێنج جۆر گوڵی بەهار بڵێ، کە لە کوردستان هەیە.

# ئەنفال



بۆ ئەوەی زیاتر لە مەرگە ساتی نەتەوەکەمان ئاگاداربین و هەرگیزاو هەرگیز ئەو قوربانییە بێتاوانانە لە یاد نەکەین و هەردەم لە بیروهۆشمان بن، بەسەرهاتی ئەو تاوانە گەورەیەتان بۆ دەگێڕمەوە، کە دەرحەق بە خەڵک و خاک و ژینگەی کوردستانەکەمان کراوە.

لاپەڕەکانی مێژووی دونیا هەڵبدەینەوە هەرگیز تاوانی وا گەورە و بێ وێنە نەکراوە، کە بۆ کوشتن و قڕکردن بەبێ جیاوازی لەنێوان ساوا و منداڵ و لاو و پیر لە پیاو و ژن، کە لەلایەن بەعسییە دڕندەکان ئەنجامدرا.

دەستی وێرانکردن و خاک سووتانیان لە هیچ کەس و لە هیچ لایەک نەدەپاراست.

دەزانن ئەم تاوانە کەم وێنەیە لە ژیان و ژینگەی ئەم نیشتمانە بۆ کرا...! چونکە تاوانەکەمان هەر ئەوەبوو، کە کوردین و خاکەکەشمان کوردستانە.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| ئەنفال | : ڕەشەکوژی |
| مەرگەسات | : نەهامەتی، تراژیدیا |
| خاک سووتان | : سوتـماک |
| تاوان | : کوشتنی بێ گوناهـ |
| دەستیان نەدەپاراست | : سڵیان نەکردەوە |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. بۆچی باسی ئەنفال دەکەین؟

٢. ئەنفال بەرامبەر کێ کرا؟

٣. ناوی وڵاتێک یا نەتەوەیەک دەزانی کە ئەنفال کرابن؟

## راهێنان (٢)

گەورە گەورەتر

تۆش ئەم وشانەی خوارەوە وەک وێنەی سەرەوە لێبکە:

١. زیرەک ...............

٢. جوان ...............

٣. بڵند ...............

٤. ترسنۆک ...............

٥. ئازا ...............

## چالاکی (١)

لە ماڵەوە پرسیار بکە بەسەرهاتێک لەسەر ئەنفال بۆ بگێڕنەوە.

## چالاکی (٢)

مامۆستای بەڕێز: ئەم دێرە هۆنراوەی خوارەوە بۆ قوتابییان ڕوونبکەوە، بۆ ئەوەی دارشتنێکی لەسەر بنووسن.

دەستی دوژمنی پڕ لە تـــــاوان
ئەم وڵاتەی کردە گۆڕی کۆمەڵان

# چالاکی (٣)

**پیتی ئەم وشانەی خوارەوە لە خانەی گونجاو دابنێ:**

١-ئەنفال
٢ - قڕکردن
٣ - شەهید
٤ - ئاوارە
٥ - مەرگەسات



# پیتـــــی چاپ



زانایەکی ئەڵمانی، ناوی گۆتەنبەرگ بوو، ڕۆژێک بۆ سەیران چووبووە ناو دارستانێک، لە گەڕانەوە ویستی دیارییەک لەو دارستانەوە بۆ منداڵەکانی بەرێتەوە، هێنای بە چەقۆ لە توێکڵی دار شێوەی چەند پیتێکی تاشیی و پارچە کاغەزێکی تێوە پێچا و خستییە گیرفانییەوە.

کاتێک گۆتەنبەرگ گەیشتەوە ماڵەوە، منداڵەکانی لێی کۆبوونەوە، تا بزانن چی بۆ هێناون، پارچە کاغەزەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و کردییەوە، کە پیتەکانی پیشانی منداڵەکان بدات.

دیتی کە کاغەزەکە ئاوی توێکڵە دارەکەی هەڵمژیوە و وێنەی پیتەکانی لەسەر دەرچووە.

گۆتەنبەرگ لەم ڕووداوە سەیرە زۆر سەری سوڕما و کەوتە بیرکردنەوە. پاشان بڕیاری دا، کە لەم دۆزینەوەیە سوود وەربگرێت و لە دوای ماوەیەک توانی پیتی چاپکردن دروستبکات.

ئەو دۆزینەوەیەی گۆتەنبەرگ دەرگای بڵاوبوونەوەی کتێبی بە ڕووی خەڵکی دنیا کردەوە و مرۆڤی لە نەزانین و نەخوێندەواری ڕزگارکرد.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| بەرەو پیری هاتن | : پێشوازیکردن |
| سوود | : قازانج |
| ڕزگارکرد | : قورتارکر |
| سەری سوڕما | : واقی وڕما، حەپەسا |
| منداڵ | : زارۆک، بچووک |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. گۆتەنبەرگ کێ بوو؟
٢. گۆتەنبەرگ لە توێکڵی دار شێوەی چی تاشی؟
٣. کاغەزەکە چی لەسەر دەرچووبوو؟
٤. گۆتەنبەرگ سەیرانەکەی بۆ کوێ بوو؟
٥. ئەو کارەی گۆتەنبەرگ دنیای لەچی ڕزگارکرد؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانە بە مانەی خوارەوە پڕ بکەوە:

( من، ئەو، ئێمە، ئێوە، تۆ )

١. .............. دەچم بۆ قوتابخانە.
٢. .............. دەچیت بۆ بازاڕ.
٣. .............. بە یەکەم دەرچوو.
٤. .............. بەرگری لە نیشتمان دەکەن.
٥. .............. ڕاپەڕینمان کرد.

# وەرزەکانی ساڵ






ئادەی ئادەی ئێمەی منـــاڵ
بیزانین بۆ زانین فـــــەرزە
یەکەم بەهار، دووەم هاویـــن
سێیەم پایز، چوارەم زسـتان
وەرزێ سێ مانگی تــــەواوە
مانگەکانی بەهار جوانـــــە
مانگەکانی هاوین ببێـــــژ
پایز لە یادمە بە ئـــــاوەز
زستان بەفرانباری لێیـــــە

با فێر بین وەرزەکانی ســاڵ
وەرزەکانی ساڵ چــوار وەرزە
خودا وەهای بۆ داناویـــــن
بیان ناسە لە کوردستـــــان
ناگۆڕێ و قەت نەگـــــۆڕاوە
نەورۆز، گوڵان، جۆزەردانــــە
پوشپەڕ، خەرمانان، گەلاوێــژ
ڕەزبەر، خەزەلوەر، سەرماوەرز
ڕێبەندان و ڕەشەمێ یـــــە.

( عەبدولڕەحمان تاوەگۆزی)

# واتای وشەکان

| وشە | واتا |
|---|---|
| فەرزە | : پێویستە |
| قەت | : هەرگیز |
| ببێژ | : بڵێ |
| لەیادمە | : بە بیرمە |



دیمەنێکی کوێستانەکانی کوردستان

# شەنـــــــــگال



شارێکی قەشەنگ و خاوێن و خۆشە، دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای هەرێمی کوردستان، ژینگەیەکی دێرینی مرۆڤایەتییە. هەر لە کۆنەوە دانیشتوانی ئەم شارە کوردبوون، هەر چەندە دوژمنان هەوڵیانداوە مۆرکی کوردی لێبکەنەوە. لە دوای ئازادکردنی شەنگال لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بایەخێکی زۆری پێدراوە، بەتایبەتی لە بواری پەروەردەوە، خوێندنی لێکراوەتە کوردی.

دەڤەری شەنگال بە پیت و فەڕە و بۆ کشتوکاڵ زۆر لەبار و گونجاوە و چەندین بەرهەمی لێدەڕوێت و هەنجیری شەنگال زۆر بەناوبانگە.

شەنگال شوێنی چل مێردە، پەرستگای شەرەفەدین و هەواری دلێرو مێرخاسانە، قەڵاتی خۆڕاگری و ڕەسەنە.

## واتای وشەکان

| وشە | واتا |
| --- | --- |
| باکوور | : ژووری، سەروو |
| مۆرك | : هێما |
| بایەخ | : گرنگی |
| دەڤەر | : ناوچە |
| دێرین | : کۆن |

## ڕاهێنان (١)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕ بکەوە:

١. شەنگال دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای .............. .

٢. .............. شەنگال بەناوبانگە.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم وشانە بخەرە ڕستە:

( دابان، من، نەورۆز، ترێ، ئەو )

## چالاکی (١)

لە دوای ئازادکردنی شەنگال حکومەتی هەرێم چی بۆ خەڵکی شەنگال کردووە؟

## چالاکی (٢)

مامۆستای بەڕێز/ نەخشەی هەرێمی کوردستان بێنە و شاری شەنگال و دهۆکی لەسەر دیاربکە.

## چالاکی (٣)

شەنگال بکە بەناونیشانی دارشتنێک و شەش دێری لێ بنووسە.

# دابەشـــــکردن

لە دارستانێکی چڕو پڕ شێر پاشایەتی دەکرد و گورگێک و ڕێوییەکیش خزمەتیان دەکرد. هەر جارەی کە شێر نێچیرێکی ڕاو بکردایە، سەرەتا خۆی تێری لێدەخوارد، پاشماوەکەشی بەگورگ و ڕێوی دەدا. ڕۆژێک شێر نێچیرێکی ڕاوکرد و لەبەردەم گورگی دانا و پێی گوت:

ئەم نێچیرە لەنێوان هەرسێکمان دابەش بکە.

گورگە نێچیرەکەی کردە سێ بەشی وەک یەکەوە، بەشێکی لەبەردەم شێر داناو بەشێکی لەبەردەم ڕێوی و ئەو بەشەکەی دیکەشی بۆ خۆی هێشتەوە.

شێر لەم دابەشکردنە زۆر توڕە بوو، تا هێزی تێدابوو، چەپۆکێکی بەسەری گورگەکە کێشا لە جێی خۆی تۆپاندی.. ئینجا بە ڕێوی گوت:

دە ئەمجارە تۆ ئەم نێچیرە لەنێوان هەردووکمان دابەش بکە، ڕێوی کەلەشی نێچیرەکەی لەبەردەم شێر دانا و گوتی:

بفەرموو قوربان...



شێر لە ڕێز و حورمەتی ڕێوی سەری سوڕما و گوتی: ئەی ڕێوی! ئەم هەموو ڕێز و حورمەتە لەکێ فێربووی؟

ڕێوی گوتی:

قوربان، لە گورگ.

## واتای وشـــــەكان

| وشە | واتا |
|---|---|
| تۆپاندی | : كوشتی |
| نێچیر | : ڕاوكراو، ئەوی بەراو، دەستگیردەكرێ |
| چەپۆك | : دەست بەسەردانان |

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:

١. شێرەكە لەسەر چی لە گورگەكە تووڕەبوو؟

٢. بە چ شێوازێك شێرەكە گورگەكەی تۆپاند؟

٣. دوای دابەشكردنی نێچیرەكە لەلایەن ڕێوییەكە شێرەكە چی پێ گوت؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بەم وشانە پڕ بكەوە:

(گورگ، تورە، تۆپاندی، چەپۆكێكی، كەلەشی)

١. لە ئەنجامی دابەشكردنی نێچیرەكە شێرەكە زۆر ........... بوو لە گورگەكە.

٢. شێرەكە ........... لە گورگەكە داو ............

٣. ڕێوییەكە ........... نێچیرەكەی لەبەردەم شێر دانا.

٤. ڕێوی لە ........... ئەم ڕێز و حورمەتە فێربوو.

## چالاکی (١)

کام لەم گیاندارانەی خوارەوە گۆشت خۆرن:
(پڵنگ- مەڕ- پشیلە- چێڵ- سەگ- ڕێوی)

## چالاکی (٢)

وشە لەگەڵ یەک گونجاوەکان لە هەردوو کۆمەڵە بە هێڵێک بگەیەنە یەک.

| أ | ب |
| --- | --- |
| گورگ | دەمیاوێنێت |
| سەگ | دەلوورێنێت |
| شێر | دەقاڕێنێت |
| پشیلە | دەنەڕێنێت |
| بزن | دەوەڕێت |

# هێز لە یەکێتیدایە



ئاشنا وەرە بـا ئـاشـنا بیـــن
لە ئاشنا چاکتر هەر وەک برابین
نەت بیستووە برا لە پشت بـرابێ
مەگەر موقەدەر لەلای خوا بـــێ
کۆمەڵێ ڕێوی شێر ئەشکێنن
پۆلێ چۆلەکە بـاز ئـەفڕێنن
تـەنها پـەنجەیەک هیچی پێ ناکـرێ
کە کردت بە پێنج کێ بەرگەی ئەگرێ
مشتە کۆڵ ئەبێ و ناو دەم ئەشکێنێ
ڕەگی پەنا گوێی دوژمـن ئـەپسێنـێ
ئـێستاش من و تۆ باوەک برابیـــن
وەکو پەروانەو شوعلە و چرابیـــن
تەماع نەکەینە ناموسی یەکـــتر
بۆ ڕۆحی یەکتر نەبین بە ئـاگـــر

(قانیع)

# واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| ئاشنا | : | ناسیاو |
| مشتەکۆڵ | : | مست |
| ڕەگ | : | دەمار |
| شوعلە | : | گڕ |
| موقەدەر | : | چارەنووس |



## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. لەبارەی برایەتییەوە پەندی پێشینان چی دەڵێت؟

٢. شاعیر نموونەی یەکێتی و هێزی کۆمەڵی بەچی و چی هێناوەتەوە؟

٣. ئایا مرۆڤ دەتوانێت بە تەنیاو بەبێ یاریدەی مرۆڤانی دی بژیت؟

## ڕاهێنان (٢)

ئەم وشانە بگەیەنە بە یەک:

| | |
|---|---|
| پیرە | بازیان |
| کۆ | قارەمان |
| دەربەندی | سوور |
| زورگە | سار |
| بەردە | مەگرون |
| مێرگە | زراو |

# سەربەستی و ئازادی



گوڵە باخێک گوتی: بۆ ئەوەی هەست بە جوانی دیمەنی سروشت بکەین و چاوەکانمان زیاتر بگەشێنەوە، گوڵی ناو باخچەکان مەقرتێنن و دوای بۆنکردنیش فرێی مەدەن. چونکە گوڵ ناسکە و بەسەربەستی دەگەشێتەوە و بۆن خۆشتر دەبێت. بولبولێکی خۆش ئاوازیش گوتی: قەفەس لەلام قێزەونە و زۆر رِقم لێی دەبێتەوە.. ئای کە حەزم لە کەش و هەوای، سەربەستییە و پێم خۆشە بە ئازادی لەم چڵ بفرِم بۆ ئەو چڵ.

پەپولەیەکی باڵ نەخشینیش گوتی: چەند شادمانم و هەست بە خۆشی و کامەرانی دەکەم.. کاتێ دەفرِم لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ. بۆنیان دەکەم. پرِ بەدڵ ماچیان دەکەم.. چونکە ژیانی بێ ئازادی بەهای نییە.

منداڵێک کە باوکی لە رِێگای خاک و باوەرِ و نیشتماندا شەهید بوبوو.. گوێی لەم قسەو باسانەبوو.. گوتی:

منداڵێکی کوردم.. گەرچی بە تەمەن بچووکم. منیش وەک ئێوە.. دەمەوێ بە ئازادی بژیم و بە ئازادیش بیربکەمەوە.. دە وەرن با پێکەوە سرودی ئازادی بۆ گەل و نیشتمان، بڵێینەوە و بە ئاوازەکانمان کوردستان سەر لە نوێ ئاوەدان بکەینەوە.

## واتای وشەکان

| وشە | | واتا |
|---|---|---|
| بگەشێتەوە | : | بکرێتەوە، ڕوناکبێتەوە |
| مەقرتێنن | : | لێیان مەکەنەوە |
| قێزەون | : | ناشیرین، ناپەسەند. |
| بەها | : | نرخ |

## ڕاهێنان (١)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە:

١. گوڵ گوتی: بۆ ئەوەی هەست بەجوانی ............... بکەن.

٢. گوڵی باخچەکان ............... هەر لە شوێنی خۆیدا ............... بکەن.

٣. بولبول دەنگ و ............... خۆشە.

٤. پەپولە گوتی: لەم گوڵ ............... بۆ ئەو گوڵ.

## ڕاهێنان (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. سەربەستی و ئازادی واتای چی دەگەیەنن؟

٢. بۆچی بولبول ڕقی لە قەفەزە؟

٣. بۆچی ژیان بێ ئازادی بەهای نییە؟

٤. منداڵی شەهیدەکە چی گوت؟

## چالاکی

دووجار ئەم دێرە هۆنراوەی (ئەسیری) شاعیر بنووسەوە:

بێرە کوردستان عەزیزم گەر تۆ سەیرانت دەوێ

بتبەمە قەندیل، ئەگەر گوڵزاری کوێستانت دەوێ

# [پێرست]


| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| پێشەکی | ٣ |
| ساڵی نوێی خوێندن | ٤ |
| قوتابی ژیر (هۆنراوە) | ٧ |
| ئارام | ٨ |
| دلڤین و ژینگە | ١٢ |
| ڕەوشتی ڕێگەوبان | ١٥ |
| کوردستان (هۆنراوە) | ١٨ |
| ناوی هەموومان کوردییە | ٢٠ |
| پەڵە هەورێک سەربوردەی خۆی دەگێڕێتەوە | ٢٣ |
| وەرزش (هۆنراوە) | ٢٦ |
| وردبین | ٢٨ |
| جەژنی دایک | ٣٢ |
| کۆمپیوتەر (هۆنراوە) | ٣٤ |
| شێخ سەعیدی پیران | ٣٦ |
| ژیریی کەڵەشێرێک | ٣٨ |
| یاسای دارستان | ٤٢ |
| وانەیەک بۆ منداڵان (هۆنراوە) | ٤٦ |
| بەسەرهاتی مشکان | ٤٨ |

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| هەنگ و گوڵ | ٥٢ |
| گۆرانی دەنکەگەنم (هۆنراوە) | ٥٤ |
| گورگێکی سپڵە | ٥٦ |
| کۆماری کوردستان | ٥٨ |
| باخی گشتی | ٦٢ |
| خۆراکی بەسوود | ٦٦ |
| جوانی بەهار (هۆنراوە) | ٧٠ |
| ئەنفال | ٧٢ |
| پیتی چاپ | ٧٦ |
| وەرزەکانی ساڵ (هۆنراوە) | ٧٨ |
| شەنگال | ٨٠ |
| دابەشکردن | ٨٢ |
| هێز لە یەکێتیدایە (هۆنراوە) | ٨٥ |
| سەربەستی و ئازادی | ٨٨ |
| پێرست | ٩١ |